وەکی گوندێن (سەرۆکانی و بیاڤێ و هلۆرا) خـەلکێ وان گونـدان هـەمی رەڤـین مـە هێـزەك ئامـادەکر داکو بـەرگریا خـەلکێ خـۆ بکـەین پشـتی ئـەم چـوینە دەڤـرا (دەشـتا زێ) هێزەکـا جاشـا ل گونــدێ (ســەرۆکانییێ) بــوو مــە زانــی کــو نــاڤێ بەرپرســێ وان (شـێخۆ) یـە خـەلکێ زاویتـەی بـوو مـە پێشـمەرگەك (سـلیمان بیبکر) یان ئـەوێ دبێـژنێ (سڤۆرە) فرێکـر و خـۆ کـرە هـاولاتی چـوو دەڤ وان و داخـازا ئـاڤێ ژێ کـر بـەلێ (شـێخۆ)ی گۆتـە وی پێشـمەرگەی ئـەز دزانم کـو تـو هـاولاتی نینـی مسـۆگەر تـو پێشمەرگەی بەلێ هەرە هەکە دێ تە کوژین پشتی کو هەڤالێ مە زڤری رۆژا پاشتر مـە خـۆ ئامـادەکر و هێـرش کـرە سـەر رەبیـێن دوژمنی خۆش بەختانـە مـە شـیا کـو زیانـەکا مـەزن بگەهینینـە دوژمنی و ب رەڤـا خـۆ را نەگەهشـتن بـەلێ مخابن پێشـمەرگەکێ مـە یـێ مێرخـاس شـەهید بـو نـاڤێ وی (شـێخ عوبیـد هـاریکی ) دیسـان هەڤالـەکێ دی ب سـەختی برینـدار بـو نـاڤێ وی (محمـد عبدالمناڤ) بەرپرسـێ رێکخـراوێ بـوو ژبلـی هنـدێ کـو داسـتانەکا سـەرکەڤتی بـوو بـەلێ ئـەم ب خـەمگینی هاتینـە ڤـە ژ بـەر وان هـەردو هـەڤالێن مـە پشـتی دەمـەکێ کـێم مـە خـۆ ئامـادەکر بـۆ رەبیێن گوندێ (بیاڤێ) و پێش وەخت مە دو پێشمەرگە فرێکرن بۆ رێکێ بۆمە ئاشـکراکەن ئێـك ژوان (صـادق گـویزی) بـوو بـەلێ رەبیـێن دوژمنـی هـەڤالێن مـە دیـتن و پێحەسـیان پاشـان داخـازا هـەڤالێن مـەکر کـو بچـنە دەڤ وان بـەلێ پێشـمەرگێن مـە رازی

نەبوون پاشی ئەو هاتنە دەڤ هەڤالێن مە وگۆتنە پێشمەرگێن مە ئەم دزانین کو هوین پێشمەرگەنە بەلێ ئەم ژی کوردین مە نەڤێت شەری دگەل هنگو بکەین ومە بۆ هنگو گەلەك فیشەك (عتاد) یێن ئینیاین پشتی کو هەڤالێن مە زڤرین مەدیت گەلەك فیشەك و زەخیرە بۆمە ئینابون مەژی رێز ل داخازا وان گرت مە شەرێ وان نەکر من دڤیا بێژم لوی دەمی وەکی بەریکانەکێ پەیدابیو دناڤبەرا رێکخراوێن مەدا چونکی ئیزگێ دەنگێ کوردستانێ رۆلەکێ بەرچاڤ هەبو ژبۆ پەخش کرنا بزاڤ و چالاکیێن پێشمەرگەی پشتی کو ئەم ژ داستانەکا سەرکەفتی دزڤرین دا ستڕانێن (شڤان پەروەری) لێدەن وهۆزانا ب پێشمەرگەی بێژن بەحسێ وێ چالاکیێ کەن ئەڤجا هەر رێکخراوەکێ دڤیا پتر ژ یادی چالاکی هەبن بەلێ داستانا ژ هەمیا مەزنتر ل سالا 1987 ێ هاتە تۆمارکرن ل ناحیا (دێرەلۆکێ) ئەڤ داستانە نە بتنێ ژئەنجامدانا لژنا ناوچا ئاکرێ بوو بەلکو لژنا ئاکرێ و شێخان و دهۆك و ئامێدی و زاخۆ ب سەر پەرشتیا لقا (1) بەشداربون پشتی نەخشە بۆ ڤێ داستانێ داناى ل رەخێ نزاری لژنا ئاکرێ و شێخان و زاخۆ دانان و ل رەخێ رۆژئاڤایێ دێرەلۆکێ لژنێن ئامێدی و دهۆك دانان داستانەکا مەزن بو و گەلەك ڤەکێشا ئەز دشێم بێژم دربەك مەزن بو ناڤ چاڤێن رژێمێ و زیانەکا مەزن ب دوژمنی کەفت و هەتا دوازدە

پێشـمەرگە شـەهید بـون ئەڤـە هنـدەك نموونـە بـون ل بـزاڤ و چالاكیێن مە.

لسالا (1982)ێ هەتا سالا (1988)ێ ئەڤ چالاكیە بـەردەوام بـون و مـە شـیا كـو بـۆ دوسـت و دوژمنـێن خـۆ دیاركـەین كـو شۆرەش دێ یا بەردەوام بیت وهـەردەم پێشـمەرگە یـێ ئامادەیـە بـەرگریێ ل مللـەتێ كـورد بكـەت پاشـی رژێمـا بـەعس چ رێـك نـەدیتن ژبلـی شـەپۆلا ئـەنفالان و سـوتن و تالانكرنـا گونـدێن كوردسـتانێ لـەوما ل رێكـەفتی 28/8/ 1988 شـەپۆلا ئەنفالان ل سەرانسەرێ دەڤەرا بادینان دەست پێكر.

# ( ئەنفال )

ل دەسپێکا هەیڤا (7) سالا 1988 ئەز ب سەرەدان چومە ئیرانێ بۆ کارەکێ فەر لنك جەنابێ سەرۆکی ومالەکا مـن دگـەل بچیکا ل رزاییێ بوو دا کو سەرەدانا وان ژی بکەم ئەو مـالا مـن یـا ئیرانێ لبەر زارۆکان بـوو دا کـو بخوینن پشتی مـن کـارێ خـۆ ل ئیرانێ بدوماهی ئینای جارەکا دی ئەم ڤەگەریاین بۆ کوردستانێ ئەم گەهشتینە سنورێ تورکیا ل (گرێ سور) ل دەشتا (بـەرازگر) ئەم سەر شەرەکێ دژوار  هەلبوین دناڤبەرا پێشمەرگەی و جاشـا و دڤی شەری دا مخابن چوار پێشمەرگە شـەهیدبون ئێـك ژ وان شـەهیدان برایـێ ئەشـقی رێزانـەی بـوو مـن نیاسـین ئـەم هـەتا بیست مرۆڤان بوین و مە ئەو شـەهید ڤەشـارتن ژ بـەر هـەڤالێن مـە زور دوەسـتیای بـون  وئـەز (6) شـەش رۆژا لـدەڤ (سـعید نـادر)ی بـوم ل گونـدێ (دەریـا سـور) ل سـەر رویبـارێ سـنورێ عراقێ و تورکا نەدهێلا ئـەم دەربـاز بـبین نـەجارەکێ و دو جـارا (سەعید نادری) داخازا تورکا کر کو رێکێ بدەنەمە ب هەر حـال رێکا مە بەردا کو ئەم دەربازببین پشتی ئـەم گەهشـتینە (کافیـا) جهێ بارەگاییێ مە  رۆژا پاشتر خەبەر بومە هات کـو رژیمـا ژ نـاڤ چویی یا خۆ بەرهەڤ دکـەت و هێزەکا مـەزن یـا ئینـای بـۆ سـەر دەڤـــەرا بادینـــان بـــۆ ئەنجامـــدانا ئـــەنفالێ ل رێکـــەفتی 1988/8/25ێ هـەر چـوار رەخـێن مـە هاتنـە گـرتن مـەژی

چەند بروسكەك بۆ مەكتب سەرۆك لێدان كو حكومـەتا عێراقـیٚ ئەم یـێن چـوار دوٚر كـرین وان  بەرسـڤا مـەدا كـو خـوٚ راگـرین و دەڤـەریٚ چـول نەكـەین هـەتا كـو ئـەم نەچـاربوین و چ مەفـەر نەمای هنگی بروسكە بۆمە هات كـو دەڤـەریٚ بـەردەین و خێزانـا دەرباز كەینە  گوندێن (تێـل و شـنگێلیٚ) دەڤـەرا (مزیریـا) لبـەر هندیٚ كو (سلیم ئەسعەد) دگەل كومەكا پێشمەرگان لویٚ دەڤەریٚ بوون بۆ ئێمن كرنا  ریكیٚ ب هەر حال ل 8/25/ مە خێـزانێن خـوٚ كـوم كـرن و هنـدەك دەوار مـە ئامـادەكرن هنـدە كەلوپـەلیٚ پێدڤی مە دگەل خوٚ ئینا ل شەڤا 26/25 ئەم رێكـەفتین هـەتا ئـەم گەهشـتینە سـەر رویبـاریٚ زیٚ ل گونـدیٚ (شـنییٚ) مـەدیت خەلكەكیٚ ئێك جار زور ییٚ لـوێریٚ بگـرە ژخـەلكیٚ ئـاكریٚ  هـەتا قەزا شێخان هندەك شیان دەرباز بـبن و هنـدەك مانەڤـە ب هـەر حالەكیٚ ئەم شیاین دەرباز ببین شەهید (عبدالله قادۆ) هاتە نـك مە و گۆتە من دڤێت هندەك پێشـمەرگان بزڤرینینـەڤ زێبـاریٚ و هندەك دگەل خێزانا دا بن و بچن بۆ چیاییٚ شـرینیٚ ئـەز دگـەل خیزانا مام شەڤیٚ ئەم  گەهشتینە سەریٚ چیاییٚ شـرینیٚ خێـزان و زارۆكێن مە گەلەك مانـدی بـون ئـەو دو رۆژ بـو ئـەم ب رێكـیٚ دهاتین بیٚ راوەستیان و بیٚ خوارن و ڤـەخوارن ب هـەر حـال مـە گـۆت ئـەم ژمرنـیٚ خـلاس بـوین پاشـی ئـەم هاتینـە گونـدیٚ( داویـدكا) گونـدەكیٚ مزویریایـە هێشـتا مـە بـاریٚ دەوارا نـەدانای خەبەرەك بۆمە هات كو لەشكریٚ عێراقیٚ گەهشتە واریٚ (هۆریٚ)

ئـانكو زور نـەمايـە بێنـە هنـداڤ گونـدێ (داويـدكا) مـە چ رێـك نـەمان ژبلى گەليێ (پالانە) و ل وێرێ بچين بۆ گونـدێ (مێـرۆز) ئەڤە دو شەڤ و دو رۆژە بێ راوستيان و خوارن و ڤـەخوارن ئـەم لرێكـێ دهـێين جارەكـا دى و ل ئێڤاريـەكا درەنـگ ل گونـدێ (داويدكا) رێكەفتين ول بەرێ سپێدێ گەهشتينە گەليێ (پالانـە) و ل وێـرێ مـە هنـدەك پێشـمەرگە هنـارتن دابـزانن ل گونـدێ (مێرۆز)ێ چ هەيە پشتى كو هەڤاليێن مە زڤرين گۆتن (مێـرۆز) ژى يـا هاتيـە گـرتن ل وێـرێ ئـەم گەلـەك بەرتـەنگ بـوين مـە نەزانى بەرێ خۆ كيڤە بدەين پاشان بداڤـە رستێ ئـەم دەربـازى دەڤەرا (رێكانيا) بـوين ئـەم دو دەمـژمێرا لهيڤيـا ژنكـەكێ مـاين لسـەر رويبـارى هـەتا كـو زارۆك بـوى ئـەز ب بـاوەرم يـا دەڤـەرا شێخان بوو پاشى هەتا ئەم هەمى دەرباز بـوين شـەڤ بسـەر مـەدا هـات هنــدەك زەلام دگــەل مــەدابون بــۆ شــەهرەزايا رێكــێ و هەلگرتنا زارۆكان و د دەمـەكى دا وانـژى خـۆ ل مـە بـەرزەكر ب هەر حال ئەم ماين بتنێ و مە سەرێ رێكا خۆ نـەدزانى نوكـەژى دەنگێ ڤيژيێن زارۆكان ل برسادا يـا دگـوهێ مـن دا ل وێ شـەڤێ مە زانى كو دوژمنى هەر چار دۆرێن مـە يـێن گرتـى مـە خێـزان دگەل هندەك گەنجان هنـارتن بـۆ دەڤـەرا رێكانيـا رەخـێ دى يـێ رويبارى جارەكا دى ئـەم زڤـرين بـۆ گـەليێ (پالانـە) ئـەم (35) زەلام بوين ومـە هـەميا خـۆ لـبن بـەرەكێ مـەزن ڤەشارت بـوو و هەر چوار رەخێن مە جاش و خۆ فرۆشان ئارمانجانێ دكر و ئەم

دبن وی بەری دابوین درەنگی شەڤێ ئەم دەرکەڤتین و چونکی شەهرەزاییێ مە خۆ ل مە ڤەشارت مە بریار دا جارەکا دی بچینە گوندێن (داویدکا و تێل و شنگێلێ) گوندێن مزویری ژووریا ئەز پێشکەفتم و هێدی هێدی هەڤال ل دویف من هاتن من دڤیا بێژم کو ئەم نزانین کا خێزانێن مە چ بسەری هاتیە ئەم بێ ئاگاینە ب هەر حال ئەم نزیکی گوندێ (شنگێلێ) بوین ل رەخەکێ ڤە تەقە ل مە هاتە کرن ومە خۆ دیت کو ئەم یێن هاتینە دۆر پێچ کرن ژ لایێ دوژمنی ڤە جارەکا دی مەڤیا خۆ قورتال کەین بەلێ ڤێ جارێ مرۆڤەکێ مە دناڤ دا ما و کەفتە دەستێ دوژمنی ناڤێ وی (حجی خالد) بوو پیرەمێر بوو ئەمژی بلندی چیاییێ (باب سێڤا) بوین هەتا ئەم گەهشتینە سەرێ چیای خوین ژ دەڤێ مە دهات دتێهنا دا پشتی کو ئەم گەهشتینە بنێ دەریا (هۆرێ) جارەکا دی دوژمنی تەقە ل مە کرەڤە پاشی دەنگێ فرۆکا هات ئەم هەمی چوینە بن تەراشا هەتا بوویە درەنگی شەڤ و مە نەشیا زیدەتر خۆ راگرین د تێهنا و برسادا جارەکادی ئەم ڤەگەریاین بۆ چیاییێ (باب سێڤا) و ئەم لدەڤەرێ دشەهرەزا نەبووین کەس ژ مە نەما بوو کو بیست جارا نەکەڤیت جارەکێ من سەحکرە دەمژمێرا خۆ کو نەجام پێڤە مایە نەمیل بس زنجیرا مای هندی ئەم د کەفتین شەڤ بوو ئەم گەهشتینە (باب سێڤا) مە دیت کو ئاگرەکێ مەزن یێ هەلە مە هزرا جاشا کر پاشان هەڤالا خۆ نزیك کر کو کۆلەکێ پەزی

جاشا ئاگرێ بەردایێ و پـێن چوی و هێشـتا کاریتـا ئـاگرێ پێڤـە مای پاشان ئەم چوینە سەرۆکانیا (بـاب سـێڤا) ومـەگۆت بـلا مـە بکـوژن مـادەم مـە تێـر ئـاڤ ڤـەخوار ل وێـرێ فـەردەکێ ئـاری و تەنەکەکا روینی مە دیتنەڤە و دگەل خـۆ ئینـان چـوار رۆژا ئـەو خوارنا مەبو پشـتی مـەزانی ئـەم یـێ ل (بـاب سـێڤا) و هەرچـوار دەورێن مە دوژمنی پێن گرتی و خێزانێن مە یـێ ل نـاڤ رێکانیـا هەمی پێن کەفتینە د دەستێ رژێمێ دا مـە چ رێـك نـەمان ژبلـی هنـدێ کـو مـرۆڤێن مـە ب خـۆ خیانـەت ل مـە کـر چـونکی ئـەم هێلاین و شـەهرەزایێ مـەژی دگـەل خـۆبری براسـتی پیلانـا وان نــەهێلانا مــەبو و چ رێـك نــەمان ئــەم مـاین ل هیڤیـا دلوڤانیـا خودێ پاشان حکومەتێ (عەفۆ) دا ئـەم نەچـار بـوین مـە نەشـیا خـۆ لسـەر پـێن خـۆ بگـرین و خێـزانێن مـە کەفتنـە د دەسـتێ حکومەتێ دا مە هزرا خۆ کر کو خۆ تەسلیمی فـەوجا سـەربازی ل (شنگێلێ) بکەین, مرۆڤەکێ دان عەمر دگەل مەدا بو ناڤێ وی (حجی عبدالله) زێبـاری خـەلکێ گونـدێ بـانیێ بـوو کـو د بێـژنێ (عەبدولا یێ مەحمیـد) دگـەل چـوار کورێن خـۆ پشـتی کـو ئـەم نەچار بوین و مە چ رێك نەماین خۆ قورتال بکەین و پشـتی کـو هنـدەك مـرۆڤێن مـە خیانـەت ل مـە کـری چـوین و خـۆ ل مـە نـەگرتی ئەڤـە دوازدە رۆژە ئـەم ل سـەر پـێن خـۆ و چیا و چیا دگـەرییێن ب نەچاریڤە مـە گۆتـە (حجـی عبداللـە) ئەڤـە بریـارا (عەفۆ) یێ یا دای بەلێ ئەم د پشت راست نینین ژ ڤێ بریارێ.

ل وى دەمى ئەم ل هنداڤ گوندێ (شنگێلێ) بوين ل پشتا گوندێ (باب سێڤا) ب هەر حال مە ئەو (حەجى عبداللە) هنارت داكو راستيا ڤێ چەندێ بزانين ئەگەر راستە كو خێزانێن مە بخێر و سەلامەتن و دل تەنگيێ بومە چێناكەن ئەم ژى دێ خۆ دەينە دەستێ حكومەتێ چونكى براستى مە هێزا چونێ نەمايە چاڤێ مە ل (حجى عبدالله) بو هەتا كو گەهشتيە دناڤ دوژمنى دا دەمێ كو گەهشتيە ناڤ سەربازێن رژێمێ ئێكسەر بر بۆ نك فەرماندێ وان و پرسيار ژێ كربوۆ تو پێشمەرگەى ناڤبرى دبەرسڤا خۆدا گۆت بوو نەخێر ئەز پێشمەرگە نينم ب تنێ ئەز يێ بۆ خۆ رەڤيم و پشتى كو حكومەتێ بريارا عەفۆيێ داى ئێكسەر من خۆ دا دەستێ هنگو پاشان پرسيار ژێ كر بو تو خەلكێ كيرێى وى ژى گۆت بو ئەز زێبارى مە ئەوى فەرماندەى گۆتە (حجى عبدالله) نو كە خەبەر بۆ من هات كو خێزانا (رزا) زێبارى ل دەڤەرا رێكانيا ل (چەم جى) يێن كەفتينە د دەستێ حكومەتێ دا پاشان (حجى عبدالله) دگەل دو جاشا هاتە نك مە و گۆت بريارا عەفۆيێ يا دروستە و خێزانێن هنگو يێن كەفتينە د دەستێ حكومەتێ دا ئەم (35) پێشمەرگە بوين مە كومبونا خۆ كر و مە برايار دا خۆ بدەينە دەستێ حكومەتێ پشتى ئەم گەهشتينە گوندێ (شنگێلێ) ياراست فەرماندێ وێ بەتاليونێ دگەل سەربازێن خۆ هەمى هاتنە درێكا مەدا و ئاڤ بۆمە ئينا كورێ من هەلگورد دگەل من دا بوو يێ بچويك بوو وان سەربازا

گەلەك كەيفا خۆ پێ ئينا پشتی كو مە چەكێ خۆ داناى هندەك سەرباز دگەل مە هاتن هەتا دەشتا زێ پاشان ئيڤايەكا سەربازى هات و ئەم هەمى سياربوين ئەم گەهاندينە (دێرەلۆكێ) ل وێرێ ئەم كرينە دخانيەكێ ڤە جهێ پەزى بوو يێ تژى زبل بوو پاشان مە خێزانێن خۆ ديتن كو هەمى يێن دناڤ زبلى دا دوى خانى دا گەلەك كەيفا وان هات كو ئەم د ساخين خێزانێن مە چيرۆكا خۆ بۆمە گۆت كا چەوا كەفتينە ددەستێ حكومەتێ دا ئەڤە دەمێ دەه رۆژانە ئەم ژێك جودا بوين پشتی كو ئەم كەفتينە دكەمينا جاشێن (ئيبراهيم منتكى) دا سريا برازايێ وى (صديق منتكى) دو جەنتێن دوبلوماسى تژى پارە و زێر كەفتنە دەستێ واندا و چون, شەڤەكێ ئەم دوى خانى دا ماين و ئەم هەمى دناڤ ئێك دا بوين جه نەبو خۆ درێژ كەى بارودوخەكێ زورێ نەخۆش بوو من كورەك هەبوو ژيێ وى 3 هەيڤ بون شوينا شيرى تليێن ترى دپەقاندنە دەڤێ وى دا هەتا كو ل (جێژنيكانێ) ئەمرێ خودێ كرى رۆژا پاشتر ئەم كرينە د دو ئيڤايێن سەربازى دا و برين بۆ كەلها نزاركێ لدهوكێ پشتی كو ئەم چوينە دناڤ كەلهێ دا هندەك ديمەن من ديتن چ چارا ژ بيرا من ناچن وەختەكێ من ديت (نورى شێخكى و محمد خالد بالەتەيى) هاتنە نك من و ساخ و سەلامەتى ل من كر و كەس نزانيت كا دێ مە كيڤە بەن ئەوێن پێشى عەفوێ خۆ دايە دەستێ حكومەتێ هەمى يێن ئەنفال كرين و ئەم نزانين كا

دوماهیا مه چیه رۆژەکێ ئەم ل وێرێ هێلاین پاشان سێ لیژنە پێك ئینان و خەلك رێز کرن و ناڤ نڤیسین هەر کەسێ ناڤێ وی نڤیسی داکەنە دناڤ ئیڤاییێن سەربازی دا و دابەن کەسێ نەدزانی بۆ کیڤە دێ بەن هەتا کو ناڤێن مە نڤیسین و ئەم هەمی کرینە دناڤ ئیڤاییێن سەربازی دا و ئەم برین بۆ مویسل پاشان هەڤلێرێ پشت عەنکاوا پاشان ئەم برین بۆ (جێژنیکانێ) هندەك مالێن مزیریان ل (بەحرکێ) بون مرۆڤێن (صنعان مزیری) دو قازانێن زادی بۆمە ئینان براستی ئەوێ خوارنێ ئەم ڤەگرتین پشتی پێنج رۆژا دوازدە هزار خێزان خەلکێ بادینان ئینانە (جێژنیکانێ) هەمیان بتنێ جل و بەرگ لبەر مابوون، مە زانی کو ئەم یێن ئیناین بۆ مرنێ ئەز باوەردکەم ئەگەر رۆژنامەڤانێن جیهانی حازر نەبانا دا مە هەمیان ئەنفال کەن هندەك زەلام هەر برن هندەك ئێزدی برن و (نوری شێخکی) بەرزە کر، پتر ژ دو سالان ئەم ماینەڤە ل وێرێ ژیانا مە کەفتە سەر خەلکێ هەڤلێرێ براستی هندی بێژین هندی بنڤیسین ئەم دەرحەقێ چاکیێن خەلکێ هەڤلێرێ دەرناکەڤین ئەز باوەرناکەم ل دیرۆکا دونیایێ من بڤی رەنگی نەدیتیە و نەخواندیە مللەتەك بڤی رەنگی هاریکاریا برایێن خۆ بکەت دختورێن مە بەلاش بون جل و بەرگ بێ هژمار بۆ دەمێ بیست رۆژا بو 24هزار کەسان کەلوپە هاتنە دروست کرن و دیسان خەلکێ هەڤلێرێ بومە خانی چێکرن , براستی ئەڤ ئەرکە ئەم وەکی بادینی دڤێت هەر

دەم قەنجییێن هەڤلێریان لسەر سەرێ مە بن دوان کاودانان دا مە هەست کر کو ئەم ملل‌ەتین خودان وەلاتین چونکی خەما مە سڤك کر بۆ زانین ئاکنجییێن (جیێژنیکانێ هەمی خەلکێ دهۆکێ و ئامێدیێ و زاخۆ و شێخان و ئاکرێ بوون بۆ دەمێ دو سالان بتنێ ئاریشەکا بچویك ژی د ناڤبەرا مەدا نە رویدا، پاشان پشتی دو سالان حکومەتێ بریارا (مەرحەمەت الرئیس) کو هەر ئێك ڤەگەریتە جهێ خۆ لبن حوکمێ زاتی ب مەرجەکێ هەر ئێك بۆ خۆ پەسەندەکێ ل وی جهی بینیت ژلایێ (مستەشارا) و مختارا، زور خەلکی بۆ خۆ پەسەند ئینان و ڤەگەریان رۆژا پاشتر پارێزگارێ هەڤلێرێ (یحی الجاف) داخازا من کر پشتی ئەز چویمە نك گۆتە من ئەڤە بریارا (مرحمەت الرئیس) یا دەرکەفتی کو هەرئێك بچیتە جهێ خۆ بەلێ بەداخەوە ئەڤ بریارە بتنێ ژ تە و و برایێن تە و خزمێن تە ناگریت, چونکە بریارا سەرۆکاتی یا ئاشکرایە دبێژیت (یستثنی من القرار رضا الزیباری واخوانە واقاربە من العودة ) ودڤێت تو ل جهێ خۆ بمینیەڤە ئەز ژێ پرسیم  بۆچی بۆمە قەدەغەیە پارێزگاری گۆتە من ئەڤە پسامێن تەنە ئەوێن ل مویسل درێکا پارێزگارێ مویسل (طاهر العانی) و  رێڤەبەرێ ئەمنا مویسل و دبێژن مە شەهیدێن بۆ حکومەتێ داین دڤێت داخازێن مە جێ بەجێ بکەن دیسان رێزا هەی ژ لایێ (صەدام حسینی) ڤە پشتی ئەز زڤریم من ئەڤ خەبەرە گەهاندیە مال براستی ئەم زور پێ

عاجز بوین هەیامەك چو بتنێ ئـەم دو سـەد مـال ماینەڤـە ئـەو مال بون ئەوێن کـو چ پەیوەنـدی دگـەل (مستەشـار) و مختـارێن حکومـەتێ ڤـە نـەبوون. براسـتی ئـەم زور ژ خـۆ ترسـیاین کـو حکومەت مە بـەرزە بکـەت, دوی دەمـی دا شـەرێ عێراقـێ دگـەل کـوێتێ دەسـت پێکـر و عێـراق چـو (کوێـت) گـرت ئـەز چـومە بارەگایێ بەعسیا ل هەڤلێرێ من گۆتێ دێ مـە کیڤـە بـەن ئەڤـە (جێژنیکان) چول بوو هەمی زڤرینـە جهـێ خـۆ بتنـێ ئـەم یـێن ماین دیسان ئـەوی ژی گۆتـە مـن مـرۆڤێن هنگـو ل مویسل بـالا دەستن وەکی دیار مابەینا هنگو یا نەخۆشـە و نوکـە ئـەو بهێـزن بەلێ من دڤێت ئاخفتنەکێ بێژمە تە و دبەرژەوەندا تەدایە بۆتە زور باشە ئەگەر بکەی, من گۆتێ خێرە گۆت ئەو مالێن ماینەڤـە ل (جێژنیکانێ) راپۆرتەکێ بۆمە بنڤیسن کو ئـەم دحـازرین خـۆ ببەخشین و بچینە کویتێ و خزمەتا دەولەتا خۆ عێراقێ بکـەین ئەز ژی دێ کەمە بروسکە راست بـۆ مەکتـەبا (صـەدام حسـینی) ,مـن ژی گـۆتێ دەرفـەتێ بـدە مـن داکـو بچـم پرسـیارا خـەلکێ کومەلگـەهێ بکـەم چـونکی نـە بتنـێ زێبـاری نـە ل وی دەمـی چوار مالێن زێباریا مابونەڤە پشتی کو ئەز زڤریم شـەڤەکێ ئـەم خەلکێ کومەلگەهێ پێکڤـە روینشـتین و مـە بریـارا خـۆدا داکـو چارەکێ ل خێزانێن خۆبکەین ژ مەترسیا رژێمێ خلاس بکە یـن بلا ئەم وەکی زەلام تێ بچین هندەك دۆسکی کورێمـەی بـوون و بەرواری, شرفانی مە بریاراخۆدا کو ئەم بچین بۆ شـەرێ کـویتێ

بتنــێ داكـو خێــزانێن مــه ژ ڤــێ رەزالــەتێ رزگـار بــبن مــه خــۆ ئامادەكر پتر ژ سەد زەلامـان و مـه خـۆ پێشكێش كـر پشـتی كـو بروسكه هنارتی بۆ (صەدام حسینی) ئێكسەر رازی بوون كو ئـەم بچین پاشان بەرپرسەك بۆمـه دانـا ئێكـێ فەلـه بـوو خـەلكێ هـه ڤلێرێ بوو ئەم برین بۆ كویتێ برینه (مینا الاحمدی) نـاڤێ مـه دانا (فوج العائدون) چل رۆژا ئـەم ل وێـرێ مـاین رۆژا دومـاهیێ ئەم زڤراندینـه هەڤلێرێ بـەری كـو ئـەمریكا بهێـت ئـەم ژمرنـێ رزگـار بـوین پاشـان ئـەم پشـت راسـت بـوین كـو حكومـەت چـنا بێژیته مه ئەم ژی وەكی هاولاتیان لێ هاتین.

وەختێ ئەم ل كوێتێ كەسەكێ كوێتی هـزرێن ئیسلامی هـەبوون و یــێ ب رێــدین بــوو زانــی كــو ئــەم ڤەگــەریاییێن ( عائــدون) پێشمەرگەیینه ئەوی كەسی هـەموو زانیـاری لسـەر ئـەنفالكرییێن بەحركێ هەبون زور باوەری ب مه دهات و هەموو نهێنیـێن خـۆ بۆ مه د گۆتن و گۆته مه خۆ ئالۆز نەكەن هەر وەختێ هێرشەكا ئــەمیركی هــات ئــەم هــەوە ب لەشـكرێ عێراقــی نــادانین و دێ رەفتارەكا باش دگەل وە كەین , و گۆت هین كـورد دێ سـەركەڤن و دێ حـوكمێ عێراقـێ كەڤیتـه دەسـتێ وە دا و مـن گـۆتێ چـەوا پشتی ڤێ شكەستنێ دێ ئەم دەسهەلاتیێ ل بەغـدا كـەین ، گـۆت دێ سـبەهی پــەرتۆكا ( امـام علـی ) بـۆ تـه هیـنم و هۆزانـا وی بخوینه دێ زانی كادێ پشتی شـەرێ عـەجما( ئـیران) و صـەدامی دێ چ ل كوردا هێت , رۆژا پاشتر ئەو پەرتوك بۆ من هینـا و مـن

دیت پەرتوکەکا زۆر کەڤەن بو و ئـەو هۆزانـا بـۆ مـن بـاس کـری نـیشامندا و پشتی من ئەو هۆزان خواندی گەلەك کەیفا من هـات و من ل دەڤ خۆ نڤیسی و ئەڤە ئەو هۆزانـە :

ویل الاعاجم من ویل یحل بهم

من صادم ظل فی رؤس و اعیاق

یأخذهم السیف فی الارض الجفار فما

و یملك الكرد بغداد و ساحاتها

الی خرسان فی شرق العراق

و یشرب الشاة و السرحان مأوها

بالأمن غیر رجاف و أفراق

# نەخۆشی و ئازارێن جیژنیکانێ

براستی گەلەك ئازار مە ل كومەلگەها جیژنیکانێ دیتن وەكی گوندێ شەبەحا بوو ترس و لەرز دناڤ گیانێ هەر كوردەكێ دا بوو جیژنیکانێ رۆژانە خەلكێ بێ گونەه دابەن و نەدزڤرنادنەڤە مە گەلەك نەهامەتی ل وێرێ دیتن شەڤەكێ هاتن چەند خێزانەكێن ئیزیدیان برن و بەرزەكرن پاشان (نوری عەبدال شێخكی) بر و حەتا نوكە یێ بی سەر و شوینە هەر ل وان رۆژا شەڤەكێ ئەز ل مال بوم وەختەكێ دەنگێ مرۆڤان ل حەوشا مەهات دەرگەهێ مە لێدا و ئەز ژخەو راكرم دەمژمێر دوویێ شەڤێ بوو من گۆت ئەو كیە بزمانێ عەرەبی گۆتن (أنت شيَخ رضا ؟ عدنا شغل معاك) تویی شێخ رزا مە شولا بتە هەی دڤێت دگەل مە بهێی من بهیست دەنگێ ئێكێ كورد دگەل وان دابوو گۆتە من كاك رزا چ هزرا نەكە ئەزێ د گەل وان دا و نەترسە من دەرگەه ڤەكر و من دیت كو حەوشا مە یا پری سیخورێن رژێمێ یە ئێكی دەستێ من گرت گۆتە من دڤێت نوكە بچینە رێڤەبەریا ئەمنا هەولێرێ، مالا مە هەمیێ ژنكا و زارۆكان بەردا گریێ, چونكی زور ترسیان, چوون هەبوو بێ زڤرین رۆژانە ئەڤ رویدانە ل جیژنیکانێ هەبوون من داخاز ژ

وان سیخوران کر کو مرۆڤەکی دگەل خۆ بینم وانژی داخازا مـن جیێ بەجیێ کر و ئەز رابوم مـن (حبیـب حجی یوسـف)یێ سـرانی دگەل خۆ بر ئێك سەر ئەم برینە ئەمنا هەولێرێ ل پرسگەهێ سیخورەکیێ ئەمنیێ ل وێریێ بـوو ل هیڤیا مـن نـاڤیێ وی (غسان العمری) بو وەکی بنەمال ئەم دناسین گۆتە من بروسکە بۆمە یا هـاتی دڤێـت هـەر نوکـە تـە ببـەین بـۆ (مکتـب شـؤون الشـیمال) نڤیسـنگەها (علـی حسـن المجیـد) یـێ ناڤـدار ب (علـی کیمیـاوی) دەمژمێر سییێ شـەڤیێ بـوو ئـەز کرمـە دترومبێلـەکیێ دا ونـەهێلا ئەو مرۆڤیێ د گەل من هاتی سیاربیت زڤرانـدە جێـژنیکانیێ مـالا مە کربو تازی چونکی هاتنـا وان زور یـا ب تـرس بـو ئـەم بوینـە دوو ترومبێل و رێکەفتین بۆ کەرکوکێ دەم ژمێر شەشێ سپێدێ گەهشـتینە کـەرکوکێ و چـوینە خوارنگەهـەکێ مـە تێشـت خـوار هـەتا بوویـە دەمـژمێر هەشـت ئـەز بـرم بـۆ نڤیسـینگەها (علـی حسن المجید) پشتی ئەم ل پرسگەهێ روینشتی ئـەو مروڤـێ ئـەز بـریم بـەری مـن چـوو ژور پاشـان گـازی مـن کـر و ئـەز بـرم سەرکەڤتین بۆ ڤاتێ دوویێ سالونەکا مەزن بو ئـەم چووینە ژور ئێك بەری من چو دەرگەهەکێ دی ڤەکر و سلاڤەك ڤەدا و گۆت گـەورەم ئەڤـە (رزا زێبـاری) مـن ئینـا بدەنگـەکێ بلنـد ل وی سیخوری خۆری گۆت زێباری ب کەرامەتن یێن د گـەل حکومـەتا خـودا و شـەهیدێن ل سـەر حکومـەتا خـۆ دایـن ئـەو نـە زێباریـە بێژێ (رزا بارزانی) چونکی ئـەوێ ژنـا بدەتـە بارزانیـان ئـەو ژی

هەر بارزانیە ئەڤ ئاخفتنە هەمی گۆتن هێشتا ئەز نەروینشتیمە پاشان هندەك ئاخفتنێن کرێت بەرامبەر بنەمالا مە گۆتن بەلێ من خۆ بێ دەنگ کر پاشی گۆتە من روینە ئەز گەلەك هەرشیم ب ڤان پەڤێن کرێت بەلێ من چ دەستهەلات نەبوو من نەزانی ئەو کیە ل جهێ (علی کیمیاوی) روینشی پشتی من پرسیار کری دەرکەفت (عقید مرعي) گۆتە من جەنابێ وی یێ گۆتیە من بینە ڤێرە و رەزیل کە پاشان گۆت ئەڤە کاغەزەکە جەنابێ (علی حسن مجیدی) یا نڤیسی و ب چەند خالان پێك دهێت دڤێت تو ئیمزا کەی ئەو کاغەز ب ڤان خالان پێك دهات:

1) تو تاونبارەکێ بارزانی نەیێ زێباری.
2) دێ سۆزێ دەی رکەبەریا لەتیف و ئەرشەد زێباری ناکەی.
3) مایێ تە ب عەشیرەتا زێباریان ناچیت نەب چاك نەب خراب.
4) نابیت بچیە مویسل ب ئێك جاری.
5) ل کومەلگەها جێژنیکانێ هەر رێکخراوەکا حزبی یان هەر کەسەك ئاخفتنەکێ دژی حکومەتێ بکەت تو پێ بەرپرسی هەر خرابیەك بهێتە کرن تودێ ل پێش چاڤێن خەلکی ل جێژنیکانێ هێیە سێدارەدان.

لدوماهیێ من گۆت دەستور هەیە باخڤم گۆتە من بێژە تە چ دڤێت من گۆتێ ئەزێ رازیمە ل سەر هەمی خالان بتنێ ئێکێ ئەز ئیمزا ناکەم ئەو ژی کومەلگەها جیێژنیکانێ (24) هزار نفوسە زور خەلك هەنە من نانیاسن ئەز چەوا دێ بمە کەفیلێ وان کو کەس خرابیا نەکەت بتنێ زێباریان دێ شێم کەفالەتا وان کەم بەلێ خەلکێ دی نەشێم ببمە کەفیلێ وان بەرێ خۆ دا من راوەستا پاشان گۆتە من ئەڤە ل سەر فەرمانا (علی حسن مجید)یە رابە ئیمزا کە ئەز رابوم من ئیمزا کر پاشان بدەنگەکێ هێدی گۆتە من دڤێت تو راستیەکێ بزانی ئەو ئاخفتنێن پێش وەخت من گۆتینە تە نە ئاخفتنێن من بوون, من گۆتێ سوپاس بۆتە ئێڤاری ئەز زڤراندمەڤ مال.


الجمهورية العراقية

قائممقامية قضاء مركز اربيل

الادارة العامة

العدد / ١

التاريخ / ٦ / ٩ / ١٩٩٠

(( من يهمه الامر ))

بناء على ما جاء بكتاب محافظة اربيل - المراسلات السرية ٤٧٠٧ في ١٩٩٠/٨/٢١ نؤيد بأن المواطن ( رضا زبير محمود ) والملصق صورته اعلاه هو من العائدين الى الصف الوطني ومن مواليد / ١٩٤٨ وسكن المدينة الجديدة ( جزنيكان ) رقم القطعة / ٥٦٢ / ولعدم التعرض زودناه بهذا التأييد وتعتبر نافذة لمدة ٣ / ثلاثة اشهر اعتبارا من تاريخه اعلاه لغرض مراجعته الدوائر المعنية لاكمال معاملته

رجاء .

عبدالمجيد سعين علي

قائممقام قضاء مركز اربيل

( عدم تعرض ) بۆ هاتوو چونا باژێرێ هەولێرێ


جمهوری اسلامی ایران

وزارت کشور

( امور بیگانگان )

کارت شناسائی رانده شدگان از کشور عراق

نام رضا نام پدر زبیر نام جد محمود

شهرت زنیباری سن ۱۳۲۷ محل تولد موصل

محل صدور کارت استان آذربایجان غربی شهرستان ارومیه

شماره کد: ۵/۲/۱/۴/۶۱ شماره کارت: ۱۸۸۰۹۶

اعتبار این کارت از تاریخ ۶۷/۴/۲۴ بمدت یکسال است.

( عدم تعرض ) یا ئیرانی وەختێ ل ئیرانێ



الى الاستاذ الفاضل

السيد محافـــــظ اربيـــــل المحترم

المعروض لمقامكم العالي :

اني /المواطن/رضا زبير محمود الزيباري الساكن حاليا في مجمع (جيژنيكان) في اربيل عند الزيارة الميمونة الذي قام بها الرفيق امين سر مكتب تنظيم الشمال الى مجمعنا وابلغنا مكرمة السيد الرئيس المناضل صدام حسين حفظه الله ورعاه بالموافقة على عودة العائدين الى الصف الوطني من سكنة مجمعنا الى مناطقهم الاصلية وعلى هذه المكرمة العظيمة من السيد الرئيس عاد الكثير الى مناطقهم ونحن ايضا قمنا بنقل عوائلنا الى محافظة نينوى /قضاء عقرة الا ان محافظ نينوى ابلغني هو شخصيا بان منطقة نينوى غير مشمولة بعودة تكم اليها بموجب التعليمات الصادرة من ديوان الرئاسة بصدد مجمعكم في اربيل وعلى هذا رجعنا الى المجمع ننتظر الاوامر وقبل عشرون يوما جاء رسول الى المجمع من قبل وزير الدولة /ارشد الزيباري وشقيقه/لطيف ادعيا بانه قد حصل الموافقة لعودة الزيباريين الى منطقة عقرة/نينوى ولكنهم الذهاب الى منطقة الحكم الذاتي بحجتها ومنها الى منطقة عقرة وفعلا قد رجعوا بهذه الطريقة غير المشروعة حوالي (٢٠٠) عائلة الى قضاء عقرة وهم هناك حاليا وبقينا حوالي (٣٠) عائلة من الزيباريين في مجمعنا عليه نسترحم سيادتكم التفضل بالموافقة بعدم حرماننا من مكرمة السيد الرئيس اسوة بالباقين ولكم الشكر والتقدير و

والامر لكم سيدي .

المستدعي/
رضا زبير محمود الزيباري
اربيل /جيژنيكان

٢/ ٩ /١٩٩٠

داخازا مه بۆ بۆ پارێزگارێ هەولێرێ ل سەر بڕیارا سەرۆکاتیا عێراقێ ( صدام حسین ) کو پشتی دوو سالا بۆ خەلکێ کەمەلگەها جێژنیکان کو بگەڕێنەوە بۆ دەڤەرا حوکمێ زاتی بەلام ل بڕیارا ( صدام حسین ) تەنها بۆ من دەرچون ل کومەلگەهێ قەدەغە بی چونکە هاتبو نڤیسین د بڕیبارێ دا ( یستثنی من قرار العفو رضا الزێباری و اخوانە و اقاربە )

# دەست درێژكرنا سیخورێن رژێمێ

**لبەر تایبەتمەندییێن كەسایەتی مە هندەك ناڤ دیار نەكرینە**

رۆژەكێ كورەكێ كچەك رەڤاند ئینا مالا من خەلكێ بادینان بوون من ڤیا بێژم كو كومەلگەهێ بگشتی زور حورمەتا من دگرت من ژی بەردەوام خزمەتا وان دكر براستی مە كەش و هەوایەكێ ئارام د ناڤ خۆدا دروست كربو و ئەم هەمی وەكی خۆشك و براییێن ئێك بوین ئەو كچا خۆ دایە رەڤاندن كچەكا جوان بو، بۆ مالا مە سوحبەت كربو كو رۆژەكێ (حمید گۆران) دگەل دوو ترومبێلێن سیخورێن ئەمنێ لدەم ژمێر 12 شەڤێ هاتنە مالا مە گۆتن دڤێت تو دگەل مە بهێی ل سەر داخازا مودیر ئەمنێ عەنكاوە ب ناڤێ( محمد صالح برایێ هشام صباح الفخری) بەلێ من خۆ ددەستێن واندا رزگار كرو من خۆ ڤەشارت دەمێ كو من چێروكا وێ هایژێ بو من ئینا دەڤ خۆ داكو بۆمن بدروستی ل سەر ڤێ رویدانێ باخڤیت پاشان ئەز ژێ پرسیم كا ئەو رویدانا ب سەرێ وێ هاتی ب سەرێ چ خێزانێن دی هاتیە گۆت بەلێ رۆژەكێ هاتنە مالەكێ كچەكا جوان هەبو لدەم ژمێر 12ێ شەڤێ دگەل خۆ بر بۆ مودیر ئەمنی من

هنارته ب دویف دایك و بابێن كچكێ را هەردو هاتنە دەڤ من
من گۆتێ باشه چ جارا (حمید گوران) دگەل سیخورێن ئەمنێ
هاتیه مالا هنگو و كچا هنگو بریه دەڤ مودیر ئەمنێ عەنكاوا
دایكا وێ گۆت بەلێ رۆژەكێ هاتن دەم ژمێر 11 ێ شەڤێ بوو
كچا من ب خۆرتی كره دناڤ ترومبێلێ دا و بر من ژی دەست ب
هەواران كر بابێ كچێ لدویف هەوارێن من هات من ژی گۆتێ
نوكه سیخورێن ئەمنێ هاتن و كچا مه بر بابێ كچكێ ئێك سەر
ل ترومبێلەكێ سیاربو و چو بەردەرگەهێ ئەمنا عەنكاوا دیت
كو كچا وی یا دناڤ دەستێن سیخوران دا لبەر دەرگەهێ ئەمنێ
پشتی كچێ بابێ خۆ دیتی خۆ دبابێ خۆ وەركر سیخور نەچار
بون باب و كچ پێكڤه برنه دەڤ مودیر ئەمنی پشتی كو مودیر
ئەمنی بڤی رەنگی دیتی چ پێ نەما گۆته بابێ كچێ من یێ
هنارتیه دویف هنگو را ئەگەر هنگو خزمەتەك هەبیت ئەزێ
دخزمەت دامە ئەگەر وێ گاڤێ بابێ كچێ ئامادە نەببا دا وێ
كچێ كرێت كەن دەمێ بۆ من ئەڤ چێروكه ڤەگێرای ئەز زور ب
ڤێ رویدانێ دل تەنگ بوم چونكی براستی نامیسا مە هەمیان
ئێك بو و ئەم دناڤ دەستێ دوژمنی دا دبێ دەستهەلات بووین من
گۆتێ ئەز دێ بو هنگو رێكەكێ دانم گەرەكا هنگو یا ل مە دیرە
و ئەو گەرەكا هوین لێ ئاكنجی زەلام كێمن و هەمی یێن هاتینە
ئەنفال كرن و بشەڤێ مە ئاگەه ل هنگو نینە ئەگەر جارەكا دی
هاتن هوین هەمی بئێك دەست ژن و زارۆك ترومبێلێن وان

بدەنە بەر بەرا و جامێن وان بشکێنن بلا مێر چ دەنگا نەکەن ئەم دێ هێجەتەکێ لێ هەلێخین پشتی چەند رۆژا خەبەرەك بو من هات کو بچمە دەڤ مودیر ئەمنی پشتی کو ئەز چوویم بو دەمەکێ درێژ ئەز ل پرسگەهێ هێلام پاشان ئەز برمە ژورا مودیری من دیت کو مودیر زور یێ تورەیە پاشی بەرێ خۆ دامن گۆتە من تو دزانی کو حوکمێ سێدارەدانێ لسەر تە بو بەلێ (سید الرئیس صدام حسین) ی تو عەفو کری و نوکە تویێ بۆیە مرۆڤەکێ خراب و خەلکی هان ددەی کو نەهێنە ئەمنێ و ئاریشا بۆمە چێ دکەی و دبێژیە خەلکێ کومەلگەهێ بەرا لترومبێلێن ئەمنێ بدەن و جاما لێ بشکێنن ما تو نزانی تویێ دەستەسەری, من ژی گۆتێ ئەزێ مەمنونم ژ حکومەتێ کو ئەز یێ عەفوکری ژ سێدارەدانێ و تو دزانی ئەزیێ دەستەسەرم دێ چەوا وێرم ڤان ئاخفتنان بێژمە خەلکی و ڤان ئاخفتنان چ راستی بو نینە گۆتە من تەیێ وە گۆتی و تە ئەو مال یا بریە نك خۆ تە ئەڤ پیلانە یا بۆ دانای پاشان تویێ چویە مالا وان و تەیێ گۆتیێ ئەگەر ترومبێلێن وان هاتن بدەنە بەر بەرا من گۆتێ مادەم تە ناڤێن وان بومن ئینان تو راست دبێژی من ئەڤە یا کری بەلێ بتنێ من نامۆسا تە یا پاراستی گۆتە من چەوا تە نامۆسا من پاراستیە من گۆتێ مرۆڤەکێ هەی دبێژنێ (حەمید گۆران) مرۆڤەکێ پیسە هەمی شەڤێ بناڤێ تە کچکێن کومەلگەهێ دەردئێخیت ب زۆری و ب ناڤێ تە ما کەس دەم

ژمێر 12ێ شەڤێ کچێن خەلکی دبەتە دەرێ ئەز دزانم کو ئـەو درەوا دکەت ئەگەر تە شولەك بکەسەکێ هەبیت دێ ب رۆژ گازی کەی نە نیڤەکا شـەڤێ .. بـۆ دەمـەکێ خـۆ بـێ دەنـگ کـر پاشـان گۆتە من برایێ (رزا) دڤێت ئەڤ رویدانە دناڤبەرا من و تـەدا نـە دەرکەڤیت و ئەز دێ لسەر شولا (حمید گۆران)ی ئاخڤم

پشتی ڤـێ رویـدانێ چ رویـدانێن دی یـێن بڤـی رەنگـی نـە هاتنـە ئەنجام دان.

بەلێ مـن دڤێـت دیـار بکـەم بـۆ ڤـان رویـدانێن بـێ ئـەخلاق هاتینەکرن د ئەنفالێ دا کو هـەر کـورد بوینـە نامۆسا کـوردا بـۆ دوژمنێ کـوردا بریـە وەکو نمونەیـەك ل دەڤـەرا رێکانیـان و ل ( چەم جی ) هنـدەك خێـزانێن پێشمەرگان هـەلاتن بـو تورکیـا و رێـك لێ هـات بـۆ گـرتن , چـەندەکا خـۆ ڤەشـارت بـو د گەلیـەکێ کـویردا و ( 6 ) رۆژان بــێ نــان و ئــاڤ و هنــدەك جــاش ســەر هەلبون . هندەکا هاریکاری لێ کـر بـو وەکـی فـەوجا ( عمـر ئاغـا سورچـی) و(سـید بـەرزنجی) زۆر ب نهێنـی نـان و ئـاڤ دا بـوویێ بەلێ هندەك بەرپرسێن فەوجا جاشا, ئێـك ژ ئەفسـەرێن کـورد و ناڤێ وی دیار ناکەم سـەر ب فـەوجا جاشـاڤە بـو هـاتبوو نـاڤ وان خێزانا کو (50) خێزان هەبون ئەفسەرێ کورد پێـنچ ئـافرەتێن جحێل و جوان لێ جـودا کربـوون و ل گـەل ئاخفـت بـو گۆتبـویێ ئــەم دێ هــەوە ژ ڤێــرە دەربــاز کــەین و دێ وە بەینــە هــەولێرێ پاشان بۆ بەغـدا و دێ هنگـو دانینـە دڤەسـرەکێ دا و بـەس هـین

دێ ب ساخی مینن و ئەوێن دی هەمو دێ هێنە ئەنفالکرن بەس ب مەرجەکێ هەر هەموو داخازێن مە دڤێن ل سەر رازیبن و ئامر لیوایێ عەرەب دێ هەوە پارێزیت ل بەغدا و دێ دژینەکا خوش دابن, ئافرەتەکێ گۆتبوییێ شەرم ژ خۆ بکە تو کوردی ئەم نامویسا هەوەینە , مە بۆ ئامر لیوایێ عەرەب دێ بەی شەرم بکە و ئەگەر تە خیرەت هەبیت مە بکوژە  دا نەکەڤینە ددەستێ دوژمنان دا , ئەڤ ئاخفتنێن بێ نامۆس چنە تو دکەی.

# رۆژەکا دی

هەر ل جیێژنیکانێ بابێ شەهید (محمدصالح بـۆتی سـلمان بۆتی) مرۆڤەکێ ئەختیار بوو هاتە دەڤ من گۆتە من لسەر دەمێ کورێ من (محمدصالح)ی یێ کو ل داستانا (کـانی ماسـێ) شـەهید بوی, ل داستانا (دێرەلۆك) لقا ئێـك تڤەنگەکا برنـۆ دەسکەفتێن داسـتانێ کـرە دیـاری بـۆمن ژبـەر شـەهید بوونـا کـورێ مـن ئـەز خەلات کرم نوکە خـودانێن وێ برنـۆیێ یـێن هاتینـە مـالا مـن و داخازا وێ تڤەنگێ دکەنەڤە یانژی حەقێ وێ بـدەمێ و تـو بـاش دزانـی کـو ئـەم ئـەنفال کرینـە و مـە چ ددەسـتان دا نیـە وەکـی ئێخسیرا بێ دەسـت هـەلاتین بـۆمن وەختـێ دانـای دڤێـت ڤـان دو رۆژان پارێ تڤەنگا وان بدەمێ بۆ زانـین ئـەوێن هاتینـە تڤـەنگێ جاش بوون مە نەڤێت ناڤێن وان دیار بکەین من گۆتێ خۆ بخەم نەئێخە کورێ تە شەهیدێ مەیە و تو هەرە مالا خۆ روینە خوار و پشت راست بە هەر چەندە مالێن مە لبن نایلۆنان بون بلا ئەو خەما من بیت دەمێ کو وەختـێ وان هـاتی بهێنـە پـارێ خـۆ مـن هندەك مرۆڤ حازر کرن دگەل خـۆ بـرن وهـەر ئێـك ژمـە دارەك هەلگرت, چونکی ئەم هەمی بـێ چـەك بـووین و چـووینە رەخ و دۆرێن مالا ناڤبری و ئەم ل هیڤیا وان ماین کەسەکێ ئـەم دیـتین

کو ئەم یێن هاتین بەرڤانییێ ل ڤێ مالێ بکەین ئێکسەر چو درێکا کومەلگەهێ دا خۆ ڤەشارت هەتا کو ئەو جاش هاتین گۆتە وان هشیار بن ژ خۆ (رزا زێباری) دگەل ژمارەکا مرۆڤان یێ ل هیڤیا هنگو و دێ شەرێ هنگو کەن پشتی وان زانی یا ب زەحمەتە بگەهنە مالا ناڤبری ئێکسەر زڤرینەڤە .

# ( دا مە کەنە بەعسی )

رۆژەکێ ئەم چەند مرۆڤەکێن بەرچاڤێن کومەلگەهێ ئەوێن کو ل بیرا من ئەزو (عارف بادی و ئەحمەد تەیار و رشید شکەفتی بەرواری و عبدالعزیز سپینداری ) و چەند هەڤالێن دی و ژمارەکا زور یا خەلکێ کومەلگەهێ ئەم ل هولەکێ کوم کرین چەند بەرپرسێن بەعسیان ل وێ هولێ ئامادەبون براستی دناڤ ئاخفتنێن خۆدا وان بەعسیان دلێ مە خۆش کر و گۆتە مە ئەم دێ ڤی بارودوخێ هنك دناڤدا دژین دێ گورین و خزمەتەکا بەرچاڤ دێ بۆ هنگو کەین بەلێ دڤێت هنك دلسوزیا خۆ بۆ حکومەتێ دیار بکەن ئەوژی دڤێت بهێنە رێك خستن دناڤ رێزێن حزبا بەعسی دا ئەڤێن دهۆلێ دا هەمی بێ دەنگ بون و کەسەکێ دەنگ ژێ نەهات ئەوان زانی کو خەلکێ نەرازیە و نابیتە بەعسی ئێك ژوان بەرپرسێن بەعسیان ب تورەیی ڤە رابو گۆت هەر کەسێ نەرازیە بلا رابیتە ڤە بتنێ ئەز رابوومەڤە من گۆتێ بەلێ هێژا ئەز نابمە بەعسی چونکی هەتا نوکە هنگو ئەم ب عێراقی نە هژمارتینە و مە دهژمێرن ئێخسرێن خۆ و ئەم دەستە سەرین نەشێن بێ دەستیریا هنگو بچینە خەستەخانێ یان دەرڤەی کومەلگەهێ بۆ زانینا تە هنگو تەنانەت ناسنامێن عێراقی یێ ل مە وەرگرتی و دگەل مالێ کو مە هەی دێ چەوا

مه ژ خۆ هژمێرن بەرسڤا من دا گۆتـە مـن مـادەم تـویێ نـەرازی
رابە ژهولێ دەرکەڤە دەمێ کو ئەز رابویم هەمی دگەل من رابـون
دەرکەفتن هەڤال (عارف بادی) ل دویف من هات و گۆتە من کاك
(رزا) تـو دێ مـە تووشـی ڤـان زالمـان کـەی بـلا تـە بڤـی رەنگـی
بەرسڤا وان نەدابا پشتی دەمەکێ کێم داخاز کر کو بچینە د نـاڤ
هولێ دا داکو شەرمێ ژ خـۆ نەکـەن و خـاترا خـۆ بخـازن ئـەم هـە
می چوینەڤە ژور بەحسێ هنـدێ نەکرەڤـە خـاترا خـۆ خاسـت و
چوون.

# سەرهلدان و كۆچا مليۆنی

دەسـپێكا سـەرهەلدانێ و كوچـا مليـۆنی مـالا مـە لكومەلگـەها بەحركێ بوو دەنگ و بـاس بـەلاڤ بـوون دنـاڤ خـەلكێ مـە دا كـو پێشمەرگە هاتنـە خـوارێ و سـەرهەلدانێ دەست پێكـر براسـتی هێزەكا مەزن يارژێمێ ل دەوروبەرێن هەڤلێرێ دبەلاڤ بـوون مـە دگۆت چ چارا پێشمەرگە نەشێن بگەهنە هەڤلێرێ بەلێ سـپێدەيا رۆژا پاشتر دەنگێ توپ و تەقەمەنيا ل هـەڤلێرێ گەهشـتەمە و مـەزانی كـو پێشـمەرگە گەهشـتە هـەڤلێرێ و شـەری دەسـتپێكر پاشی خەبەر گەهشـتە مـە كـو ل هاڤينگـەها سـەلاحەدين مللـەت رابوو سەرخۆ و سەرهەلدانێ دەستپێكر ئێكسەر ئەز رابوم دگەل هندەك مرۆڤێن خۆ (احمـد ميكائـل و ئەزوەرعبداللـه و عبداللـه حـەجی سـليمان) چـو ينـە مەسـيفی, بـەرێز مسـعود بـارزانی ل وێرێ بوو ئەز چومە نك جەنابێ مسعود بارزانی گۆتە مە مالێن هنگو لكيرێ نە من گۆتێ مالێن مە يێ ل بەحركێ دوان ئاخفتنـا دا ديار بوو خەلكێ هەڤلێرێ رەڤين بۆ مەسيفی ل جـادا مابـەينا هـەڤلێرێ و مەسـيفی ترومبێـل چـوار رێـزی دهـاتن وەكـی رۆژا حەشـرێ پاشـی فـرۆكێن هليكۆپتـەر هاتنـە هنـداڤ وی خـەلكی, گوندێ ملائومەر و تەقە ل مللەتی كر من گۆتە جەنابێ وی مـە

چ ترومبێل نین کو خیزانێن خۆ ڤەگوهێزین یانکو خلاس کەین گۆتە من بۆ خۆ سەحکەنە ترومبێلەکێ پاشی ( سیهادێ) برایێ مسعود بارزانی بۆمە پاسەك پەیداکر بەلێ مخابن نە دوهن نە گازوایل نە شوفێر دوێ ترومبێلێ دا نەبوو پشتی هنگی ئەو جهـ هەمی پربون ژ مەخلوقاتی براستی ئەم گەلەك شەپرزەبوین بۆ خێزانێن خۆ چونکی مە چ ژ وان نەزانی ئەز و هندەك مرۆڤێن مە وەکی (احمد میکائیل و ئەزوەر و عبدالله نپاخی) ب پیا ئەم رێکەفتین بۆ چەپێن مەسیفی مە نەشیان ل سەر جادێ بێین ژ بەر ترومبێلان پاشی بۆ دەستێ راستێ مە لادا بۆ بەحرکێ پشتی ئەم گەهشتینە کومەلگەها بەحرکێ هەر وەکی چ چارا کەس ل ڤێرە نەژیە جهەکێ چول و بێ دەنگ هەمی یێن رەڤین بۆ وان دەشت و زیران ب هەر حال مە خێزانێن خۆ دیتنە ڤە دبینم کورێ من پێشکەفتی تڤنگەکا کەلاشینکوف یا پەیدا کری و برایەکێ وی یێ ل پشتا وی هێشتا ژیێ وی (13) سال بون ئەز گەهشتمێ و من چەکێ وی ژێ ستاند و هاڤێت پاشی ئەز کەفتمە بەراهیا وی خەلکی و ئەم رێکەفتین بۆ گوندێ (میران خورا هەرکیا) پاشی ل وی چیای ئەم سەرکەفتین و دەنگێ گریا زارۆکان ل هەمی جها دهات تێنی و برسی ب هەرحال پشتی شەڤەك و رۆژەکا مە خۆ گەهاندە سەر جادا بەرامبەر ناحیا حەریرێ پاشی لۆریەك هات بۆ مە راوەستا و ئەم هەمی سیاربوین ئەم برین هەتا خەلیفانێ جارەکا دی ئەم

ب پيا رێكـەفتين بـۆ ديانـا مەنـە ديـت جهـەك يـێ بـەتال  بـێ راوەستان ئەم رێكەفتين بۆ دەڤـەرا بالـەكيا مـە بريـاردا  كـو (3) سێ رۆژا  ل بالەكيا بمينينەڤە پاشان ئەم رێكەفتين بۆ ئيرانـێ ل رێكـێ كـورێ مـن كرمـانج بـەرزە بـوو ئـەم گەلـەك شـەپرزەبوين لدوماهيێ ئەم چووينە مزگەفتێ بانگ راهـێلا كـو زارۆكـەك يـێ بەرزەبوى ناڤێ وى كرمانجە و جل و بەرگێن وى بڤى رەنگى نـە بەلێ بێ فايدە بوو وەختەكێ دايكا وى بەردا گريـێ ژنكـەك هاتـە دەڤ دايكا وى و گـۆت كـورێ تـە يـێ ل مـالا هـەنێ ئێكسـەر دايكـا كرمانجى قەستا وێ مـالێ كـر ديـت كـو كـورێ وى يـێ دخـانى ڤـە ڤەشـارتى و جلكـێن وى يــێن لێ گوهـۆرين پشـتى كـو كرمــانج هەلگرتى گۆتە وێ مالێ باشە ئەڤـە دو دەمـژمێرە مـەلا بـانگى را دهێليت بۆچى هنگو كورێ من نە ئيناڤـە خـودانێ مـالێ خـۆ بـێ دەنگ كر ديار بوو كو دڤيا ئەو كور بۆ وى بيت ب هەر حال مـە كورێ خۆ ديتەڤە و جارەكا دى ئەم رێكەفتين بۆ ديانا وبارانـەكا زور ل مە بارى ئـەم گەلـەك بـێ عـەيش بـوين دنـاڤ مخلوقـاتى ل چومان  ئەم لێك بەرزە بوين (3) سـێ زارۆك دگـەل مـن دا بـون من رێكەك گرت و خێزانا من رێكەك گرت و ئەم رێكـەفتين مـن سێ زارۆك ڤێ بون خـەلك نەدشـيا ل ئـەڤرازيا سـەركەڤيت لبـەر تـەڤنێ ئـەز نەچـار بـوم مـن هەرسـێ زارۆكـێن خـۆ دانانـە بـن كەڤرەكێ ومن هێلان ئەز چوم بـۆ (زێـوێ) ل سـەر بـەرەكێ ئـەز روينشتم من هزرێن خۆ كرن ئەز نزانم كا خێزانا من چ بسـەرى

هاتیه ومن هەرسێ زارۆکێن خۆ یێن هاڤێتین دلێ من هند مابوو کو ب راوەستیت من نەزانی چ بکەم ژیان ل پێش چاڤێن من رەش بو وەختەکێ دبینم رێزەکا مرۆڤان سەرکەفتن کو هەرسێ زارۆکێن من یێ دگەل وان دا ئەز چومە بەرا وان مرۆڤا من گۆتە وان ئەڤە زارۆکێن منن گۆتە من چەوا تو دبێژی ئەڤە زارۆکێن منن ما چ باب هەنە زارۆکێن خۆ بهێلن من نەزانی چەوا بەرسڤا وان بدەم من گۆتە وان هوین کینە دیاربو دەرکەفتن (گەردی ل کومەلگەها سێ بیرانێ) بەلێ من چ رێکێن دی نەبون ب هەرحال ئەم رێکەفتین پشتی (3)سێ رۆژان ل دیانا ئەم گەهشتینە حاجی ئومەران من جەنتەك هەبو دگەل خێزانا من دابو بەلێ کلیلێن وێ جەنتێ دگەل من دابون پشتی کو خێزانا من چویە پشت سیمەی ل سنورێ ئیرانێ بۆ خۆ رێکەك دیت و دەرباز بون هندەك پاسداران خێزانا من دیت کو جەنتەکا رەش یا دبلوماسی یا دگەل دا چون و رێکا وان گرت نەهێلا دەرباز ببن و ئەو جەنتە ل وان ستاند داخازا کلیلا ل خێزانا من کر بەلێ کلیل دگەل من دابون پاشان جەنتە شکاند هندەك کاغەزێن من تێدا بون و نیشانەکێ زبێر ئاغای تێدابو ئەو نیشان (وسام الرافدین) بوو حکومەتا عێراقێ خەلات دابو بابێ من, ئێك ژ پاسدارێن ئیرانی ئەو نیشان هەلگرت و بر نیشا بەرپرسێ خۆ بدەت پشتی دەمەکێ ئەڤسەرەکێ ئیرانی هات و زانی کو خودانێن وی نیشانی کینە ئێکسەر ترومبێلەك بۆ

خێزانـا مـن گـرت بـۆ بـاژێرێ (شـنۆیێ) لسـەر حسـابا حکومـەتێ لبەر خاترا وی نیشانی بۆ زانین ئەڤ سوحبەتە خێزانا من بـومن ڤەگێرا ڤە چونکی ئەم ژێك بەرزە ببوین ب هەر حال پشتی ئەز گەهشتیمە سنوری من گەلەك چاڤێ خۆ ل خێزانا خۆ گێرا بـەلێ مـن نـەدیتن پشـتی کـو ئـەز ژ سـیمەی دەربـاز بـویم مـن سـیهاد بارزانی دیت ترومبێلەك بۆ من دابین کـر ئـەو هەرسـێ زارۆکـێن دگەل من دا من کرنە دترومبێلێ دا و ئەز رێکـەفتم بـۆ (خـانێ) پاشـی بـۆ (نەغـەدەی) ل وێـرێ پۆلیسـان ئـەز گـرتم و داخـازا ناسـنامێ ل مــن کــر مــن ژی چ ناسـنامە دگــەل دانــەبوون و ترومبێل یا بێ ژمارە بوو سەحکرە سەروبەرێ مـە و ئـەز دگـەل خـۆ بـرم بـۆ رێڤەبـەریا پشـکنینێ وەختـەکێ ژنـەك هـات ئـەو هەرسێ زارۆکێن مـن دیـتن کـو سـەرو چاڤێن وان هـەمی تـەڤنن گەلەك دبـێ سـەروبەر و برسـینە خـۆ ل وان پۆلیسان تـورە کـر گۆتـە وان چـەوا هنگـو ئـەڤ مرۆڤـە دەسـتە سـەر کریـە رێکـێ لێ بەردەن بلا بچن پاشی ئەم رێکەفتین چوینە (شنۆیێ) من پـارە نەبون جارەکێ کورەکێ مـن بـۆ سـێڤا گـری مـن نەشـیا بـۆ بکـرم پاشان ئەم چوینە ناڤ مالا (بیلار سورچـی) خیزانـا مـە زور بـوو دەه رۆژا ئـەم ل مـالا وان بـوین پاشـی مـن قەسـتا مەکتـەبا سیاسـیا پـارتی کـر ل دەڤ (علـی عبداللـه)ی داکـو هاریکاریـا مـن بکـەن چـونکی مـن چ نـەمابو ب هـەر حـال لـدویف شـیانێن خـۆ شیان(3000) دیناران بدەتە من من ژی هندەك ئەرزاق و تەباخ

و بەڕکەك پێ کرین بۆ خێزانا خۆ ئەم دوازدە نەفەر لسەر بەرکەکێ دنڤستین و گەلەکا بالیف نەبون بڤی حالی مە قەتاند هەتا سالا (1991) پاشی وەکی هەمی خەلکێ ئاوارە ل ئیرانێ ئەم ڤەگەریاینە باوەشا کوردستانێ.



فارس ئاغا زێباری ل بەر دەرگەهێ قشلا ئاکرێ ل سالا ( 1937 ) دگەل رە سپی و ماقویلان یێ روینیشتی و ل پشت وی چەند چەکدارەکێن زێباری نە.



مەحمود ئاغا زێباری ل دەستێ راستێ (ابراهیم فیصل انصاری رئیس ارکان الجیش العراقی) و ل دەستە چەپ عبد الجبار طیب نەڤیی وی و وەرگێرێ وی

| | |
|---|---|
|  |  |
| **فارس ئاغا زێباری** | **مەحمود ئاغا زێباری** |

| | |
|---|---|
|  |  |
| **تەتەرخان مەحموود ئاغا زێباری ل سالا 1981 ب دەستێ سیخورێن سەدام حسێنی ب ترومبێلێ هاتە تیرۆرکرن** | **زبەیر مەحموود ئاغا زێباری ل سالا 1980 ب ژەهرێ هاتە تیرۆرکرن** |



**کورێ مەزن یێ مەحموود ئاغای ( طیب ) ل نەخوشخانا بەیروت ل سالا ( 1949 )**



**رزا زێباری ل گەل تیبا شانویا هەولێرێ ل سالا(1970 )ل**

**مووسل ل ئاهنگا یازدێ ئادارێ**



**رزا زێباری ل نیڤەکێ دگەل چەند هەڤالەکێن شانوگەریا هەولێر ل سالا ( 1970 ) ل ئاهنگا سەر خوشی و دەرچونا بەیانا یازدێ ئاداری**



**دەستێ راستێ زبێر ئاغا دگەل ( مرجع ) ێ نەجەفێ و دەستێ چەپێ سەرۆك کومار ( عبد الرحمن عارف ) ل قەسرا کوماری ل بەغدا**



عمر مەحموود ئاغا

زێباری (عەمێ)

ل سالا 1981 ب دەستێ سیخورێن

سەدام حسێنی ب ترومبێلێ هاتە تیرۆرکرن





**هوشیار مەحموود ئاغا زێباری**



**ئامر هێزێ ئاکرێ زبێر ئاغا ل بیرەوەریا دامەزراندنا پارتی دیموکراتی کوردستان ل گەل حوکمەت و جەماوەرێ ئاکرێ ل ئاکرێ ل سالا ( 1971 )**



ل گەل قایمقامێ ئاکرێ (جلال خوشناو) و لژنا ناڤخۆیی و ئەڤسەرێن پێشمەرگەی ل بیرەوەریا یازدێ ئادارێ ل سالا (1972 )



ل دەستێ چەپێ عبد القهار فارس ئاغا
و زبێر ئاغا و محمد فارس ئاغا



زبێر ئاغا ویسام ئەلرافیدەین ژ
لایێ سەرۆك كومارێ عیراقێ  عبد
السلام عارفی ڤە وەردگریت



پێشمەرگە سەرتراشیێ دکەت بۆ زارۆکێن پێشمەرگا ل شۆرشا گولانێ ل گوندێ کافیا دەڤەرا زێبار



**رزا زێباری ل شۆرشا گولانێ ل گوندێ کافیا دەڤەرا زێبار کارێ جۆتی دکەت ل سالا (1984)**



**رزا زێبارى ل دوماهيا رۆژ هلاتا چيايێ گارەى و د گەل سێ زارۆكێن خۆ ل سالا (1985)**



**دابەشكرنا گوشتى ل سەر مەفرازا پێشمەرگەى ل چيايێ توبا، دەستێ راستێ يێ سيێ رزا زێبارى و يێ چارێ هوشيار زێبارى**



**ل نیڤا هەر دوو برایێن خۆ فرزندە و شیمال ل گەلیێ بالندا بۆ هنارتنا دایکا خۆ بۆ ئیرانێ پشتی کو حکومەتا بەعس دەرکری ل سالا (1985)**



رزا زێباری د گەل (علی خلیل خوشەڤی) ل سالا (1992) ل شەقلاوە



**رزا زێباری دگەل ( شێخ سعید بەرزنجی ) شێخێ رێکا بەرزنجی**

**ل گەلیێ عبدالعزیز ل ئاکرێ**



رزا زێباری د گەل مەفرەزەکا پێشمەرگا ل چیایێ گارەی



دەستێ چەپێ رزا زێباری و عبدالعزیز طیب و شوکت شێخ یزدین و هوشیار زێباری ل کۆنگرێ (11 )ێ یێ پارتی دیموکراتی کوردستانێ ل سالا (1993 )



**ل گەل بارزانی ل گوندێ نیاڤوكێ ل ناڤ عەشیرەتا هەركیا ل سالا( 1991 )**



**ل گەل مەسعود بارزانی ل مەكتەب سەرۆك ل هاوینەهواری سەلاح دین**




ل گەل مەتران (مەرتومە) يێ ئاشوٚريا ل دەڤەرا نەهلێ و صباح بيت الله جێگرێ لقا ( 9 ) يا پارتى ئاكرێ



ل گەل قەشە (حەنە زێبارى) ل گوندێ شەرمن



ل گەل لقا ئافرەتان و چەند ئەندامێن لقا ( 9 ) یا پارتی ل بیرەوەریا دامەزراندنا یەکێتی ئافرەتان ل سالا (2009)



هەلبژارتنێن ئێکەم پەرلەمانێ کوردستانێ ل سالا (1992 ) ل گوندێ شەرمن



رزا زێباری ل سەر گورێ هوزانڤانێ مەزن ئەحمەدێ خانی ل بازێرێ بازیدێ




**ل سەر گورێ شاعرێ مەزن (فەقیێ تەیران) ل نیزێك قەزا موكسێ پارێزگەها وانێ كوردستانا توركیا**



ل گەل شاندەکێ دەڤەرا ئاکرێ ل سەر گورێ بارزانییێ نەمر و ئیدریس جانەمەرك ل بارزان




ل گەل شاندەکێ دەزگاییێ ئەنفالان ل گەل (عدنان مفتی)

سەرۆکێ پەرلەمانێ کوردستانێ ل ناڤ هۆلا پەرلەمانیدا




دیمەنەێن دەڤەرا زێباری (بێرما ئاڤێ) ل گوندێ بانیێ




**دەشتا نیێ ل دەڤەرا زێبارێ گوندێ کافیا**




**گەلیێ نیێ دەڤەرا زێبارێ**




**گوندێ شەرمن**



**ئاهەنگا نەورۆزێ ل سالا ( 2009) گوندێ شەرمن دەڤەرا زێبارێ**



**رزا زێبارى د گەل گارەییێ کورێ خۆ- پشتى بریندار بووى**



**شێخ جلال الدین البریفکانى و مەحموود ئاغا زێبارى**



**گەريانا بارزانى بۆ دەڤەرا سوران ل سالا 1944**



**بابكر زێبارى و عەبدولا قادۆ و فەيزو زێبارى و بشار محەمەد على**



رزا زێباری د گەل زێبارییێن دەڤەرا زاخۆ



گوندێ کافیا ل سەردەمێ شۆرەشێ



**مەحموود ئاغا زێباری**



**سەرۆك بارزانی و هشیار زێباری**



**کومەکا پێشمەرگان ل دەڤەرا زێبارێ**



**ئافرەتێن زێباریان د کەڤندا**



**رزا زێباری و علی شنگالی و ئازاد بەرواری و هوشیار زێباری**



رزا زێباری



زارۆکێن رزا زێباری ل ئیرانێ



**دەڤەرا زێبارێ**

الموصل في ١٩٤٤/٩/٩

عزيزى محمود اغا الزيبارى المحترم ٠

تحيـــة واشواق ٠

مع كل الاسف لم اتمكن من زيارتكم في موسم هذا الصيف كما كنت متاملا حيث كنت مشغولا جدا في الموصل ٠ والان اني عازم على السفر بالاجازة في انكلترة لاقوم بفريضـــة الزواج واعتقد بان هذا الخبر يسركم ايضا ٠ ولي الامل ان اعود ثانيةالى العراق في الربيع المقبل وساكون ممتنا لو تتمكنون ان تجدوا لي ستة جلود صنصار من الجنس العال والتي اعتقد ان احسن جنس منها هي متوفرة في طرفكم لانى بحاجة اليها لعمل معطف منها لزوجتي ٠

ولي الامل الان بان قد تمكنا من اتخاذ الترتيبات اللازمـــة للحصول علي توزيعات جيدة من الحبوب والاقمشة الى النواحي التي هي في اشد الحاجة اليها وسوف لا تلاقون اى صعوبات في خلال الشتاء المقبل وكذلك لا توجد أسباب داعية لاعادة المنازعات السابقة الموجودة بين العشائر الامر الذى يسبب مشاكل للطرفين للعشائر والحكومـــة معاً ٠

انشاء الله سوف اجلب زوجتي الى الجبال الشمالية التي نحبها جدا انا وزوجتي في السنة المقبلة ٠ هذا وبالختام ارجو قبول فائق احترامي وتحياتي الخاصـــة ودمتم محترمين ٠

المخلص

Wilson

معاون مشاور السياسي
للمنطقة الشمالية
في الموصل

**ناما راوێژکارێ حاکمێ سیاسی یێ بریتانی ل عیراقێ بۆ محمود ئاغا زێباری**



**رزا زێباری د گەل ل ئەحمەد ئاغا سەرۆکێ عەشیرەتا پنیانشیان ل تورکیا**



**شەهیدێ نەمر شعبان غەفار**

***سوپاس بۆ ڤان هێژایان کو هاریکاری و پێزانین داینه مه :***

- **زید محمد فارس زێباری**
- **نعمان سلیم خان زێباری**
- **یونس شینۆ زێباری**
- **مهدی سلیم خان زێباری**
- **شێخ عبدالرزاق زێباری**
- **بورهان زێباری**

## رزا زێباری د چەند رێزكاندا

- رزا زبێر زێباری ل سالا 1948 ل گوندێ نپاخیێ ل دەڤەرا زێبارێ هاتیە دنێ.
- هەتا قوناغا چوارێ ل گوندێ ناڤبری خواندیە.
- قوناغا پێنجێ و شەشێ ل قوتاپخانا سەعدون تمام كریە.
- قوناغا ناڤنجی ل ناڤنجیا (مەركەزیە ل نەبی شیت ل مووسل تمام كریە.
- ل سالا 1970 گەهشتیە ناڤ رێزێن شۆرەشێ و هەتا نهو پێشمەرگەیە د ناڤ رێزێن پارتی دا.
★ پلە و بەرپرسیارتییێن نڤیسەری وەرگرتی:
- ل سالا 1970 دبیتە بەرپرسێ رێكخراوا پیرس ل هێزا ئاكرێ ل شۆرەشا ئیلونێ.
- ل سالا 1982 دبیتە سەرپەرەشتێ لژنا ناوچا ئاكرێ ل شورەشا گولانێ.
- ل سالا 1984 دبیتە سەرپەرەشتێ لەشكری ل لژنا ئاكرێ.
- ل سالا 1998 دبیتە بەرپرسێ زێرەڤانیا هەڤدە ل ئاكرێ.
- ل سالا 2002 دبیتە فەرماندێ سوپایێ 15 ل فەرماندەیا دهۆك.
- ل سالا 2004 دبیتە فەرماندێ سوپایێ 6 ل ئاكرێ.

# ناظةرؤك

پەیڤا نڤیسەری ........ 4
زانا وسەرۆك و ناڤدارێن زێباریان د مێژوویێ دا ........ 5
زێبارێ ........ 12
ناڤێ زێبارێ ژ کیرێ هاتی یە ........ 14
مالباتا ئاغاییێن زێباریان ........ 20
کوشتنا حاکمێن سیاسییێن ئنگلیزی ........ 21
مەحەمەد ئاغایێ باپیرە گەورێ مە پێنج کوڕ هەبون ........ 26
قاسدێ بارزانی بۆ مەحمود ئاغای ........ 33
خولێن پەرلەمانێ عێراقێ لسەر دەمێ فارس ئاغا و مەحمود ئاغا ئەندام پەرلەمان ........ 34
بارزانی و زێباری ........ 36
پەیوەندییێن شێخێن بارزان دگەل ئاغاییێن زێباریان ........ 38
مەلا مستەفا بارزانی ل سالا 1903 هاتیە سەر دنیایێ ........ 38
پەیوەندی دناڤبەرا زێباریان و بارزانیان دا ........ 39
پرۆپاگندە دژی زێباریان ........ 45
رویدانا گوندێ ( ئەرەدنا ) ........ 46
رویدانا دل تەزینا زێوکا ئاکرێ ........ 48
نڤیسەر د بیر و دیتنێن خۆدا کی یە؟ ........ 50
پەیدابوونا دوبەرەکییێ دناڤبەرا بارزانی و زبێرئاغای: ........ 60
( ئەز و زیندان ) ........ 64
خیانەتکاریا جەزائیر ........ 68
هاریکارییێن زبێر ئاغای بۆ ( قیادا موئەقەت ) شۆرەشا کوردستانی ........ 71
تیرۆرکرنا هەردو مامێن من ( تەتەر و عەمێ ) ........ 78
گەهشتنا مە بۆ ناڤ رێزێن شۆرەشا گولانێ ........ 82
داستانا شەرمنێ و شەهیدبوونا ( شعبان غفار ) ........ 88
داستانا سەرێ باکورمان ........ 92
داستانا برکا ئینێ ........ 95
( ئەنفال ) ........ 99

